


وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
زانکۆی سلێمانی
کۆلیژی کارگێڕی و ئابوری/ ئێواران
بەشی ئابوری

# کەرتی کشتوکاڵی و بەربەستەکانی بەردەم گەشەپێدانی ئابوری

ئامادەکردنی خوێندکار : خالد حمە غریب
سەرپەرشتیار : مامۆستا گۆڤار بەگزادە



٢٠٢٤ ساڵی خوێندن ٢٠٢٥

# پێشەکی

لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی کشتکوالّیدا، وەکو هەر پرۆسەیەکی بەرهەمهێنانی تر هەموو دەستەبەرەکانی بەرهەمهێنان و ئامڕازەکانی بەشدار دەبن، سەرەڕای هێزی کار. بەڵام لەبەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا زیاتر لەهەر پرۆسەیەکی بەرهەمداری، پشت دەبەستێت بەو دەستەبەرانەی کە لەسروشتدا بوونیان هەیە وەکو فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان ( زەوی_ ئاو_- دیاردە سروشتییەکان)، بۆیە گەشەپێدان لەم کەرتەدا تاڕادەیەکی زۆر بەستراوەتەوە بە ئامڕازە بەرهەمهێنەرە سەرەکییەکانەوە. کە زەوی کشتوکاڵی و جۆری کەڵکەکەی و ڕەخساندنی بەشێوەیەک بۆ بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی باش لەبار بێت. هەروەها ئاو گرنگی کەمتر نییە لە گرنگی زەوی و دابینکردنی لەپرۆسەی بەرهمهێنانی کشوکاڵیدا، بەتایبەتی لەو ناوچانەی بۆ مەبەستی ئاودێری دەستکرد پێویستییەکی لەبەرچاوە بەهۆی وشکی کەشوهەواکەیەوە، سەرەڕای شارەزایی دەربارەی کاروباری کشتوکاڵی.

گەشەپێدانی کشتوکاڵیش، پشت دەبەستێت بە گەشەپێدانی پیشەسازی، چونکە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان پێویستیان بە پیشەسازی تەحویلی و ئیستخراجی هەیە، هەتا کەرەستەی تری لێ بەرهەمبهێنرێت، کە مرۆڤ پێویستی پێیانە، بەمەش پاش دەرهێنانی ئەو کەرەستانە، نرخی بەرهەمەکان بەرز دەبنەوە. دەبینین گەنم وەکو خۆی نرخی هەرزانە، بەڵام کاتێک دارشتەکانی تری لێ بەرهەم دێت نرخەکانیان بەرز دەبێتەوە، کە بە ( بەهای زیادبووی کاڵا- القیمە المضافة للسلعة) دادەنرێت، لەئەنجامی گۆڕینی گەنم بۆ کەرەستەکانی تر.

لەم باسەمدا دەربارەی کەرتی کشتوکاڵی دەدوێم و کاریگەری لەسەر گەشەپێدانی ئابوری و ئەو بەربەستانەی هۆکارن بۆ سستکردنی گەشە ئابورییەکە.



## کشتوکاڵ چییە؟

وشەی کشتوکاڵ وشەیەکی ئاوێتەیە و لە هەردوو وشەی (AGRI) واتا کێڵگە یان خاک، هەروەها وشەی (CULTURE) واتا چاودێری، بۆیە دەکرێت بوترێت کە کشتوکاڵ بریتییە لە چاودێریکردنی کێڵگە. واتا کشتوکاڵ سەرجەم ئەو چالاکییانە دەگرێتەوە کە جوتیار ئەنجامیان دەدات، وەکو کێڵانی زەوی و ڕواندنی بەروبومەکان بۆ بەرهەمهێنانی بەروبومە ڕووەکییەکان، هەروەها کڕین و بەخێوکردنی کێڵگەکانی مریشک و ئاژەڵداری، هەروەها کارێک بێت لە کێڵگەکاندا ئەنجام بدرێت، بۆ ئامادەکردن و پێگەیاندنی بەروبومەکان بۆ بازاڕ و ڕادەستکردنی بەگەنجینەکان.(١)

کشتوکاڵ، واتا پرۆسەی چاندنی بەروبومی ڕووەکی و بەخێوکردنی پەلەوەر و ئاژەڵەکان، بەمەبەستی بەرهەمهێنانی کاڵا و پاشان لەپرۆسەی خزمەتگوزاریدا وەکو بەرهەمێکی کەڵکدار مرۆڤ سودی لێ دەبینێت و بۆ بەردەوامی ژیان پشتی پێدەبەستێت، هەروەها لە چەرخی نوێدا وەکو زانستێک و هونەرێک پۆلێنکراوە لەناو زانستە ئابورییەکاندا، کە دەشێت وەکو سەرچاوەیەکی ئابوری گرنگ حیسابی بۆ بکرێت

## گەشەسەسەندنی ئابوری چییە؟

گەشەسەندنی ئابوری زاراوەیەکە ئاماژە دەکات بۆ کێشەی وڵاتانی گەشەکردوو، کە ئابوریناسان جیاوازی دەکەن لەنێوان زاراوەی گەشە و گەشەپێدان کە بەگشتی گەشەی ئابوری بۆ وڵاتانی پێشکەوتوو، هەروەها گەشەپێدانی ئابوری بۆ وڵاتانی گەشەکردوو بەکاردەهێنێت.(٢)

**لەڕێی زیادبوونی داهاتی تاک و چاککردنی ژێرخانی ئابوری و گەشەی پیشەسازی و گەشەسەندنی مرۆیی و نەهێشتنی هەژاری و نایەکسانییەوە گەشەسەندنی ئابوری بەدەست دێت.**



(١)مامۆستا گۆڤار بەگزادە، وانەی ئابوری کشتوکاڵی، ساڵی خوێندن 2024-2025، ل 3.

# پرنسیپەکانی ئابوری کشتوکاڵی

پرنسیپەکانی ئابوری کشتوکاڵی، کە لقێکە لە لقەکانی زانستی ئابوری، مەبەست لێی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و دابەشکردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانە. ئەم زانستە لە چۆنیەتی بەکارهێنانی سەرچاوەی کشتوکاڵی سنوردار دەکۆڵێتەوە بۆ نمونە : زەوی- ئاو- کارکردن- سەرمایە)، بەشێوازێکی چالاك و كاریگەر بەمەبەستی بەدەمەوەچوون و دابینکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا لە خۆراك و کەرەستە سەرەتاییەکان.(٣)

## پرنسیپەکانیش ئەم بابەتانە دەگرێتەوە: (٤)

یەکەم- بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی: لێکدانەوەی بڕیاری جوتیارانە دەربارەی چی و چۆن و کەی چاندن بکەن.
دووەم- خواست و خستنەڕوو: دیاریکردنی نرخەکان لەبازاڕی کشتوکاڵیدا.
سێیەم- تێچووی بەرهەمهێنان: ئەژمارکردنی تێچوونەکان و لێکدانەوەی قازانجی پرۆسەکە.
چوارەم- سیاسەتی کشتوکاڵی: کاریگەری پشتیوانی حکومەت و باجەکان و کۆسپەکانی بەردەم بازرگانی کشتوکاڵی.
پێنجەم- گەشەپێدانی لادێکان: بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی جوتیاران لە لادێکاندا.
شەشەم- بەکارهێنانی سەرچاوەکان: تەرخانکردنی سەرچاوەکانی کشتوکاڵکردن، بەشێوازێکی چالاك و بەردەوام.

3) Andrew Barkly, and Paul W. Barkly, Principles of Agricultral Economics, Routledge, First Published, 2013, pp 29-64-197- 293.
4) Andrew Barkly, and Paul W. Barkly, Principles of Agricultral Economics, Routledge, First Published, 2013, pp 29-64.

## بیردۆزەکانی گەشەسەندن و ڕۆڵی کشتوکاڵ

### وەرچەرخانی ئابوری و گەشە

زۆربەی کات وەرچەرخانی ئابوری لە کشتوکاڵەوە بۆ چالاکییەکی تر گەشەی ئابوری دەخولقێنێت. لەگەڵ گەشەی ئابوریشدا، کەرتی کشتوکاڵی گەشە دەکات، گەشەکردنەکەشی بە بەراورد بە کەرتی پیشەسازی و خزمەتگوزاری هێواشترە، هەروەها کشتوکاڵ ڕێژەیەکی کەمبۆوە لە دەستیکار و بەرهەمهێنان و خەرجی بەکاربەران دەنوینێت.

هەروەها وەرچەرخانی چالاکییەکان لە کشتوکاڵەوە بۆ چالاکی ناکشتوکاڵی، لەگەڵ بەرزبوونەوەی داهات لەناوچەکانی جیهاندا ڕوودەدات.(٥)

بەستنەوەی دوو کەرتی کشتوکاڵی و ناکشتوکاڵی، تێڕوانینێك دەخولقێنێت دەشێت بۆ پتەوکردنی چۆنیەتی گۆڕانکاری تەکنیکی لە کشتوکاڵدا بۆ گەشەسەندنی ئابوری بەکەڵك بێت.

5) George w. Norton- William A. Masters, Economics of Agricultural Development, Routledge Published, 2010, p 89.

# بیرۆدۆزەی گەشەسەندن و ئیستراتیجیەتی گەشە

بڕیاردەرانی سیاسەت، هەمیشە پێشنیازی ئەوەیان کردووە کە وەبەرهێنانە تایبەت و گشتییەکان ئاراستەی هەردوو کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازی بکرێت، لەزۆربەی وڵاتاندا، کشتوکاڵ کەرتێکی هەژمونکارە کە زۆرینەی سەرچاوەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە. بەڵام ئەم ئاراستەیە هەژارترین خەڵکەکان دەگرێتەوە کە کەمترین دەسەڵاتی سیاسییان هەیە. ئەم ڕێسا سیاسییە لاوازە وەبەرهێنانەکانی کشتوکاڵ هێواش دەکاتەوە، بەڵام فاکتەر هەن کۆسپ بۆ ئەو وەبەرهێنانانە دادەنێن. شایانی باسە بەگشتی، زۆربوونی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی دەبێتە زیادبوونی چالاکییەکانی تر، لەبەرئەوەی چەندین جوتیار سەرچاوەکانیان لە پرۆژەی ناکشتوکاڵیدا بەگەڕ دەخەن، هەروەها نزمبوونەوەی تێچوونی خۆراك یارمەتی کەسانی تر دەدات کە کاڵاو خزمەتگوزارییەکان بە بڕی زیاتر بکڕن، بۆیە وا دەردەکەوێت کە کشتوکاڵ کەرتێکی گەشەکردووی هێواشە، هەرچەندە بزوێنەری زۆربەی کەرتە ئابورییەکانی ترە، سیاسەتمەداران بەگشتی تەقەلا دەدەن کە دانیشتوانی ناوچە ژیارییەکان قایل بکەن کە سیاسەتی نزمکردنەوەی نرخی کەرەستە خۆراکییەکان پەیڕەو بکەن، ڕۆڵی نزم بوونەوەی  نرخی خۆراك، قازانج کەم دەکاتەوە.(٦)

6) George w. Norton- William A. Masters, Economics of Agricultural Development, Routledge Published, 2010, p 122.

# گرنگترین ئیستراتیجییەکانی گەشەپێدانی کەرتی کشتوکاڵی و ئابوری(٧)

1- ئیستراتیجیەتی گەشەی هاوسەنگ:

**واتا بەرنامەکانی گەشەپێدان هەموو کەرتە ئابورییەکان دەگرێتەوە، وەبەرهێنان بەسەر کەرتە ئابورییە جیاوازەکاندا دابەش دەکرێت و لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ دەبن، چونکە هەر کەرتێك نوێنەرایەتی بازارێك دەکات، بۆ دەرهاویشتەی کەرتەکانی تر. بۆیە دابەشکردنی وەبەرهێنان لەسەر ئاستی کەرتە جیاوازەکان، ڕۆڵێکی بەهێز دەداتە ئابوری نیشتمانی کە توانای زالبووني بەسەر زۆرێك لەبەربەستەکانی گەشەکردندا هەیە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئابورییەکی بەهێز لەهەموو کەرتەکانیدا هەبێت. ئەمەش لەڕێگەی پرۆسەی گەشەپێدانی کەڵەکەبووی خۆیەوە، کە خۆی خۆی بەهێز دەکات.**

2- ئیستراتیجیەتی گەشەی ناهاوسەنگ:

واتا تیشك خستنەسەر پێشکەوتنی کەرتێکی سەرەکی ئابوری لەلایەن وڵاتانەوە، بەهۆی نەبوونی سەرچاوەی دارایی بۆ وەبەرهێنان، لەکەرتە جیاوازەکانی تردا، بۆیە هەموو چاوەکان لەسەر ئەو کەرتەیە، تاوەکو پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینێت و ببێتە هۆکارێك بۆ پێشکەوتن لەکەرتەکانی تردا.

٧) **مامۆستا گۆڤار بەگزادە، وانەی ئابوری کشتوکاڵی، ساڵی خوێندن** 2024-2025، **د** 3.

# پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی لە کشتوکاڵدا(٨)

لە ئەرکە سەرەکییەکانی بەرەو پێشبردنی گەشەسەندنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و شارستانییەت، بریتییە لە هاوبەشیکردنی پرۆسەی گەشەسەندنی نیشتمانی لەزۆربەی کەرتەکاندا. لەپێش هەموو ئەوانەشەوە، کەرتی کشتوکاڵە، لە زۆربەی وڵاتاندا، بایەخێکی تەواو دراوە بە جۆرە هەمەچەشنەکانی پێداویستییە تەکنۆلۆجییەکان لە ئامێر و کەلوپەل، ئەمەش لە بارودۆخی ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتوریدا، رەنگی داوەتەوە. فراوانبوون لە بەکارهێنانی تەکنۆلۆجیادا دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی بەرزکردنەوەی ئاستی پێشکەوتنی هێزە بەرهەمهێنەکان لە ناو کۆمەڵگادا، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی بەجێگەیاندن بۆ زیادکردنی بەرهەمهێنان، کە لەئەنجامی زیادبوونی بەرهەمدارییەوە ڕوودەدات، بەجۆرێك کە زاراوەی بەرهەمداری، ئاماژەیە بۆ پەیوەندی نێوان بەکارهێنراوە مادییەکان و بەرهەمهێنراوە ماددییەکان.

دەربڕینی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی، واتا زیادبوونی بەرهەمهێنان لە کشتوکاڵدا، کە ئەم زیادبوونە دوو ئاڕاستە لەخۆ دەگرێت:

یەك- فراوانبوونی ئاسۆیی: واتا زیادبوونی پانتایی زەوی کشتوکاڵی، ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەی هێزی کار، بەهۆی بەکارهێنانی ئامێرە کشتوکاڵییەکانەوە بە شێوەیەکی بەرفراوان.

دوو- فراوانبوونی ستونی کە مانای گەشەی بەرهەمهێنانە بۆ یەکەیەکی ڕووبەر، واتا تێکرایی بەرهەم کە ڕەنگدانەوەیە بۆ پێشکەوتنی ستونی، ئەمەش دەربڕینە بۆ بەرزبوونەوەی پانتایی زەوی کشتوکاڵی بەهۆی پێداویستییەکانی بەرهەمهێنانەوە، ئەویش دەبێتە هۆی زیاد بوونی بەرهەم بەهۆی زۆربوونی تێکڕایی زەوییە چێنراوەکانەوە.

٨) الموسوي، رحمن حسن، الإقتصاد الزراعي، دار أسامة للنشر، عمان- الأردن، الطبعة الأولى، 2013، ص 87-88.

# پیسبوونی ژینگەی کشتوکاڵی(٩)

گواستنەوەی ماددەی پیس بوو بۆ ناو هەوا و لەوێشەوە بۆ ژینگەی سروشتی و ڕووەکی دەستکرد (کشتوکاڵی)،

لەو پرۆسە ئالۆزانەیە کە تا ئێستا نەتوانراوە سیستمێکی ژینگەیی وەکو (خاك) یاخود ڕووپۆشکەرێکی ڕووەکی چارەسەر بکرێت. پیسبوونی هەوا بەهۆی باران بارینەوە، هەروەها کارلێکی کیمیایی لە پرۆسە سەرەتاییەکانی پیسبوونی ژینگەی کشتوکاڵییە.

سیستمی ژینگەیی و ژینگەی دارستانە فراوانەکان کە کەشووهەوایان مامناوەندە بە هەرێمێکی گونجاو دادەنرێن بۆ پاککردنەوەی پیسبوونی هەوا و ژینگەی کشتوکاڵی،

هەروەها خاك هەمیشە وەکو پێشوازیکارێك بۆ مادده پیسبووەکان ئەژمار دەکرێت بەهۆی چالاکییەکانی مرۆڤەوە. لە کانزا و پێکهاتەکان کە بۆ پیسبوونی ژینگە بەرچاون، ئەمانەی خوارەوە کورت دەکەینەوە:

1- قورقوشم: لە سروشتدا بە بڕی کەم بوونی هەیە و لەناوچە شاخاوییەکاندا زیاترن، هەروەها لەناو ئاو و هەوادا، بەڕێژەی کەم بوونی هەیە. بەڵام لەسروشتدا بە فراوانی بوونی هەیە، لەو ناوچانەشدا کە قورقوشم دەردەهێنرێت بۆ پیشەسازی، ڕادەی پیسبوون بەم توخمە بەرزترە. سەرچاوەی سەرەکی ئەم ڕەگەزە لەناو شارەکاندا بەهۆی گازە خنکێنەرەکانەوە پەیدا دەبن کە لەڕێی ئامرازەکانی گواستنەوەوە پەیدا دەبێت کە بە بەنزین کار دەکەن.

2- توخمی بچوکتر: خاکی دارستانەکان ناوچەیەك نین بۆ هەبوونی قورقوشم، بەڵکو توخمی تری ورد، بوونیان هەیە، ئەم توخمانە کاریگەری بایۆلۆجییان هەیە، کاتێك لە ژینگەیەکی وشکدا کەڵەکە دەبن، توخمەکانی ( کادمیوم- نیکل- مس- فلۆر- توتیا- تەنگستن- زەرنیخ- مەنغەنیز- کلۆر- ئاسن). ئەم توخمانە کاریگەری جیاوازیان هەیە لە سەر ڕووەك، بۆ نمونە ئاسن و مەنغەنیز و مس، کاتێك بوونیان هەبێت لەناو خاکدا، بۆ گەشەکردنی سروشتی زۆر بەکەڵکن بۆ ڕووەکەکان.

٩)حجوز، عبدالناصر، عبدالعليم، مركز الكتاب الأكاديمي، عمان- الأردن، الطبعة الأولى، 2014، ص 103,107,108.

# واقیعی کشتوکاڵ لەعێراق دوای ساڵی 2003

زانایانی شوێنەوار، نیشتمانی کشتوکاڵ دەستنیشان دەکەن بە باکوری عێراق ( کوردستان)، کە تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (12000) ساڵ پێش زایین لەناوچەی زەرزی لە پارێزگای سلێمانی، و لەدێی چەرمو کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ناوچەی چەمچەماڵەوە. پشتیوانی کەرتی کشتوکاڵی لەعێراقدا دوای ساڵی 2003 و بەپێی هەڵسەنگاندنەکانی ساڵی 2010، (5%)ی بەرهەمی ناوخۆیی گشتی پێکهێناوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە کەرتی کشتوکاڵ هاوبەشییەکی زۆر کەمی کردووە. هۆکارەکەشی دواکەوتوویی گەشەپێدانی کشتوکاڵی بووە لە عێراقدا، ئەمە بە یەکێك لە شێواوی پەیکەرەی ئابوری دادەنرێت لە عێراقدا. بەجۆرێك کە سیستمی حوکمڕانی لەعێراق وەکو کەرتێکی سانەوەی سەیری کەرتی کشتوکاڵی دەکات، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە ( پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی) نەگەییشتۆتە عێراق، هەروەها سەرچاوە و توانا کشتوکاڵییەکان و ناسەقامگیری ئاسایش و سیاسی لەعێراقدا، هۆکار بوون بۆ خراپ بەکەرهێنانی ئەم سەرچاوانە.

کەرتی ئابوری کشتوکاڵی لەعێراقدا بەوە جیادەکرێتەوە کە پێویستی بەم شتانەی خوارەوە هەیە:

یەك- سەرمایەیەکی جێگیری گەورەی پێویستە، هەروەها ماوەی گەشەکردنی زۆر خاوە.

دوو- پەیوەندی کەرتی کشتوکاڵی بەو بارودۆخە نا سەقامگیرانەوە کە دڵنیایی تێدا نییە و کاریگەری خراپی لەسەر بەرهەمهێنان داناوە.

سێ- کەرتی کشتوکاڵی لەگەڵ بوونەوەرێکی زیندوو ( ڕووەك و ئاژەڵ) دا مامەڵە دەکات، کە هەرووکیان پێویستیان بە کاتی زۆر هەیە بۆ گەشەکردن.

چوار- پەیوەندی کەرتی کشتوکاڵی بەچالاکی زۆربەی وەزارەتەکانی حکومەتەوە، بەتایبەتی کەرتی ئاسایش و کارەبا و نەوت و پیشەسازی و بازرگانی و ژینگەیی و سەرچاوەی ئاوی و خوێندنی باڵا و دارایی.



# هۆکارەکانی بەربەست لەبەردەم پاشەکشەی کەرتی ئابوری کشتوکاڵی لەعێراق (١٠)

بەم خاڵانە کورتی دەکەینەوە:

1. کێشەی ئاو.
2. کێشەی سوێریی.
3. کێشەی نوسراوە یاسایی و تەشریعییە کشتوکاڵییەکان و ئاژاوەگێڕییەکەی.
4. کێشەی نەچوونە ناو ڕێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتییەوە.
5. کێشەی دواکەوتوویی تەکنیکی و تەکنۆلۆجی.
6. کێشەی نزمبوونەی خەرجی وەبەرهێنان.
7. کێشەی واقیعی جوتیاری عێراقی.
8. کێشەی کەم بەرهەمهێنانی سامانی ئاژەڵی.

١٠) الزبيدي، عدنان عبدالأمير، الواقع الزراعي في العراق بعد 2003 التحديات والحلول، مركز البيان للدراسات والتخطيط، العراق، 2022، ص7-8.

# گەشەپێدان و ئابوریی ئاودێریی و ئاو

دوای جەنگی جیهانی دووەم ، چالاکی ئاودێری بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو خۆی دەرخست، کە بەشێوەیەکی گەورە لەپرۆسەی گەشەی بەرفراوانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا بەشداربوو، ئەمەش وای لە کۆمەڵگای مرۆیی کرد کە دانیشتوانە زۆربووەکەی بەخۆراك تێر بکات. هەروەها دەبێت جیاکارییەك بکەین لەنێوان ئاودێری بەرهەمداری کشتوکاڵی و خۆشگوزەرانی ئابوری، هەروەها لەنێوان بڕێکی گەورە لە تەرخانکردنی سەرچاوە بەشێوەیەکی خراپ، کە شانبەشانی فراوانبوونی ئاودێری هاتە پێشەوە. پرۆسەی سەرچاوە ئاوییەکان بەشێوەیەکی زیادەڕۆ گەشەی کرد، خەرجییەکی زۆری بۆ تەرخان کرا، سیستمی ژینگەیی زیانی زۆری بەرکەوت، سەرچاوەی ماسی زۆر پوکانەوە، سەرچاوەکانی ئاو پیسبوونیان بەسەرداهات.(١١)



11) Karina Scheongold, The Economics in Water, Hndbook of Agricaltural Economics, Vlo:3, North, Holand, 2001, p 2934.

# بەربەستەکانی بەردەم گەشەنەکردنی ئابوری کشتوکاڵی لەعێراق

## کێشەی گەندەڵی دارایی و ئیداری و ئابوری لە کۆمەڵگای عێراقدا

عێراق لەو وڵاتانەیە کە بەدەست گەندەڵییەوە دەناڵێنێت، کە گەندەڵی دەبێتە هۆی زیادبوونی تێچوونی بەرهەمهێنان، کەمبوونەوەی قازانج، یاخود زیان لەهەندێك کاتدا، ئەمەش زیان بە گەشەی ئابوری دەگەیەنێت و بڕی خەرجی لەسەر مامەڵەکانی تایبەت بە بەرهەمهێنانەوە لە هەردوو کەرتی تایبەت و گشتی ، بە فاکتەرێکی زیانبەخش دادەنرێت بۆ کەرتی کشتوکاڵی.



## کێشەی سایلۆ و خراپ عەمبارکردنی بەروبومی کشتوکاڵی

زۆرێك لەبەروبومە کشتوکاڵییەکانی وەکو میوە و سەوزە و شیرەمەنی و گۆشتەکان، ڕووبەڕووی خراپ عەمبارکردن دەبنەوە، کە ئەم پرۆسەیە لە سیاسەتی کشتوکاڵیدا، لە ئەرکە بەرچاوە زۆر پێویستەکانە، هەروەها ئاساییشی خۆراك پەیڕەو ناکرێت کاتێك یەکێك لەو بەروبومە تەمەنی کورتە بۆ عەمبارکردن لەبەرئەوە زوو تێکدەچێت.

# کێشەی بە بیابان بوون و ڕوتەنی بوون

ساڵانێکی دوورودرێژە فاکتەرە مرۆییەکان هاوکارن لە بەبیابان بوون و ڕووتەن کردنی زەوی کشتوکاڵی، بارودۆخی ژینگەیی و وشکەساڵی و بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرما و ئاستی بەهەڵمبوونی زۆر و تێکچوونی سەرچاوە ئاوییەکان، ڕۆڵێکی خراپیان گێڕاوە لە کەرتی کشتوکاڵدا. هەروەها باش ئیدارەنەدانی سامانی ئاوی و وەبەرهێنان، هەروەها ئاودێری دێمی و خراپی خاك و پشتنەبەستن بە ئامرازی نوێ بۆ ئاژەڵداری و بەخێوکردنیان، لەگەڵ کەمبوونەوەی ئاستی ڕووبار و دەریاچەکان هۆکارن بۆ تێکچوونی سیستمی کشتوکاڵی و گەشەسەندنی ئابوری لە عێراقدا.

# بڵاوبوونەوەی گێلێتی و هەژاری و کەمی مەعریفی

ئەمانە هەموو بوونەتە خراپ بەکارهێنانی سەرمایەی مرۆیی لە کەرتی کشتوکاڵدا، بەتایبەتی لە سەرچاوەی سروشتی، زیاد لەوەش مرۆڤەکان بەبێ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە پەنا دەبەنە بەر داربڕین و زەوییە کشتوکاڵییەکان دەکەن بە شوێنی نیشتەجێبوون و خراپ بەکارهێنانی ئامێری کشتوکاڵی و پەیینی کیمیایی و کوشتنی مێرووە زیانبەخشەکان بە پشتگوێخراوی، پیسبوونی خاك و ئاو و سامانی ئاژەڵی و جێبەجێکردنی پرنسیپی خراپ لە کێڵگە و لەوەڕگاکاندا.


کێشەی لاوازی دەزگاکانی چاودێری و پسکنین
ئەو کێبەرکێیانەی ڕووبەڕووی دەزگا چاودێرەکان دەبێتەوە، ناتوانێت کارە نەرێنییەکان لەناو کادێرەکانی ناو ئەو پرۆژانەدا بدۆزێتەوە، دیاردەی خۆقوتارکردن لە چاودێری و لاوازی بەجێگەیاندنی کارگێڕییانە و نەبوونی بەرپەرچدانەوەی ئەو دیاردانە، باری کەرتەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و ئابوری لەق کردووە.



## کێشەی هەناردە نەکردنی بەروبومە کشتوکاڵییەکان و هاوردەکردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان

لەبەرکەمی بەرهەمهێنان هەناردەکردن، زۆر سنورداره، بەڵام کێشەی هاوردەکردن کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بودجەی کورتهێنان داناوە، هاوردەکردن لەساڵی (2002) بە ڕێژەی ( 47,6%) بووە، هەروەها بۆ پڕکردنەوەی کارتی تەموینی، حکومەت ساڵانە بڕی ( 3.5) ملیار دۆلار بۆ هاوردەکردن خەرج دەکات، لەساڵی 2007 -2010، هاوردەکردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان ( 17,2) تریلیۆن دینار بووە، کە ئەمەش کاری لە هاوسەنگی بازرگانی کشتوکاڵ کردووە لە عێراقدا.

دەرئەنجام

عێراق لەدێر زەمانەوە، وڵاتێك بووە، كشتوكاڵ شۆڕشی یەكەمی خەڵكەكەی بووە. لەم پێناوەدا، هەتا سەردەمێك كە ژمارەی دانیشتوان، ڕێژەیی بووە و بەڕادەیەكی بەرز زیادی نەكردووە، خەڵكی بەشێكی زۆری لە ژیانی خۆی تەرخان كردووە بۆ كشتوكاڵ و بەشێوەیەكی بەرچاو سوودی لێ بینیوە، هەرچەندە بەروبومەكە سەرەتایی بووە و ئامێر و پێداویستییەكان تا ساڵانێكی زۆر، هەتا ساڵانی 1958، بەرەو پێش نەچووە، بەڵام لەگەڵ گۆڕانی باری سیاسی لەعێراق و هاتنە پێشەوەی سیستمێكی جیاواز گۆڕانكاری بەسەر كەرتی كشتوكاڵدا هات و كەمێك بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوە بینی.

بەڵام دڵخۆشكەر نەبوو، چونكە سیستمی فیودالی لە عێراقدا، دیاربوو لەو تاوانانەدا كە دەرهەق بە جوتیاران و خاوەن زەوییەكان لە لادێكاندا بەشێوەیەكی تایبەتی بەڕێوە دەچوو، بۆیە لەعێراقدا كەرتی كشتوكاڵی نەیتوانی، وەكو كەرتێك بۆ گەشەپێدان و گەشەسەندنی ئابوری و قازانجی دارایی و زیادكردنی بەرهەم و خودبژێوی سوود بە تاكەكانی كۆمەڵگا بگەیەنێت.

بۆ ئەوەی لەم دۆخە دەربازمان ببێت، پێویستە هەنگاوێكی جددی بنێین بەرەو گۆڕانكاریی ڕیشەیی و پێشخستنی كەرتی كشتوكاڵیی بەهەموو سەرچاوەكانییەوە ڕووەكی و ئاژەڵی و سامانی ماسی. لە پشتبەستن بە زانست و تەكنۆلۆجیا و توێژینەوەی نوێ و دابینكردنی بودجەیەكی گەورە لەپێناو بە خۆماڵیكردنی بەرهەمی كشتوكاڵیدا.